پێشکەشە بە:

- کەس -

ناوی کتێب: کتێبی سفر

نووسەر: عومەر جەلال

بابەت: شیعر

تیراژ: ٥٠٠ دانە

دیزایین و کاری هونەریی: ئارام شوانی

چاپ: چاپەمەنی ژێنەر

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٣٥٥)ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی رۆشنبیری و هونەری چەمچەماڵ

بەیانییەک، لە کولانەی سەگێکدا دەمدۆزیتەوە!



بەدەم گۆرانییەکی ناکۆتاوە خۆم وندەکەم

شەپۆلێکی ئاو دەمهێنێتە بوون ..

نهێنی ناوەوەی بەرد دەمشارێتەوە

باران لە باخچەیەکدا بانگم دەکات ..

دەشێ، هەرگیز نەمدۆزیتەوە

(با) بەو هەموو شێتییەی شوێنم ئاشکرا نەکات

شیعر، چۆڕ چۆڕ بەدوامدا وێڵبێت

هاورێکانم بێهودە بگەڕێنەوە

کەس نەزانێت

لە کولانەی سەگێکدا خۆم بخۆمەوە ..

تەنیا دوکەڵی جگەرەکان هاورێمبن

کولانەی سەگێک بۆخۆم چێ دەکەم

تەنیایی نەمناسێتەوە

ئێوارە شەرم رۆ بکات

شەویش نەتوانێت بانگم بکات

شیعر بۆ سەگەکان دەخوێنمەوە

حەپە حەپم ئاوێتەی زمان دەبێت

مانگ دەهێنم بۆ کولانەکەم و ئیدی ناوەڕێم بەئاسمان ..

دەشێ، بەهار بە تەڵێک نێرگزەوە بەدوامدا بگەڕێت و نەڕۆمەوە
کولانەکەم ئازیزتر بێت ..
پایز بە شۆخییەوە گەڵاکانیم لەبەر بکات
خۆم لەبەردەمیدا رووت و قوت بکەمەوە
میز بەریتمی وەرینی گەڵاکاندا بکەم ..
دەشێ، زستان ئارەزووی ئەوەبێت لە کولانەکەم دەرم بکات
رەتیبکەمەوە!
باران، ببێتە میوان و بەفر گەمەی منداڵانە
هەر وەڵامی نەدەمەوە!
دەشێ، هەینییەک بێت و بڵێت: پشووە لەم کولانەی سەگە دەرچۆ
سۆزانییەک بێت و بۆنی ژیانم بۆ بێنێت
گەڕەکێکی منداڵیی بە پەپولەی پایزییەوە بێت و نەیناسمەوە
کولانەکەم ببێتە ماڵی هەمیشەم
ببمە خاوەن رۆحێکی ئاژەڵیی
لە پشتی ژیان خۆم ونبکەم ..
کێ دێت بۆ ماڵم دەرگەی لێناکەمەوە
جەنگ دێت من لە کولانەی خۆم دەرناچم
براکانم یەکدی دەکوژن
من لە چاوەڕوانی سوقانێکدا خۆم دەکوژم ..
ئاشتی بەگۆچانێکەوە دێت!



من دەبمە پاسەوانی باخچەیەکی نامۆ
بەتاسەوە لە گەمەی عاشقەکان دەنۆڕم
ئارەزووی مردنێکی قەیرە دەکەم ..
ئەفسوس، لە کولانەی سەگیش پیریی هەیە
تارماییەکانی مردن لێم نابنەوە
حەپەم دێت لە ترسی مردن
منداڵێک، بە کۆلارەیەکەوە دێت و نامدۆزێتەوە
دەزووەکەی بە کولانەکەمەوە دەپسێت
باڵندەیەکی ونبوو لە فڕین
نزیک نزیکم دەبێتەوەو نامبینێت
ئاوێنەیەک، لەتکراو بە یادەوەریی
تەماشام دەکات و نیشانم نادات
سێڵاوێکی سەرخۆش دێتە لام و سڵاو ناکات
من لە کولانەی سەگێکدا وندەبم ..
خۆم، خۆم نادۆزمەوە
لەودیوی جوانییەوە تۆ دێیت و دەمدۆزیتەوە!
حیکایەتی عەشق دێنی و برسێتیی تەنیاییم دەشکێنی
کەمێک شێتیی دێنی و ئاوەزم دەدەیتەوە
نازانیت رەنگی جەنگەڵم گرتووە و
لەسەر دەست دەڕۆم!

تۆ گۆچانێکی نەمریم بۆ دێنیت
دەمبەیتەوە پشت ژیان
سێبەری خۆم لە کولانەی سەگێکدا جێدەهێڵم
تۆ دەرۆی دەیهێنیتەوە ..
رۆحم لەبەردەم کولانەیەکدا سەما دەکات
تەنیا تۆ دەیناسیتەوە
چاوەکانم لەتەک چاوی سەگێک گۆڕیوە
دەستەکانم بە پشتی سەگێکەوە جێماوە
کەس نامدۆزێتەوە تۆ نەبێت
کەس بەلامدا نایەت تۆ نەبێت
کەس بۆنم ناکات بەوێنەی تۆ
بۆنی کەس سەرسامم ناکات جگە لەتۆ ..
بۆنت دەکەم لەودیوی بێدەنگییەوە
بەئەندازەی بۆنکردنی سەگێک لەبەردەم ئازاری برسێتییدا ..
کێ دەتوانێت بمدۆزێتەوە، شێت نەبێت؟
کێ دەتوانێت بمخوێنێتەوە، شاعیر نەبێت؟
کێ دەتوانێت بمنووسێتەوە، عاشق نەبێت؟
کێ دەتوانێت لەکولانەی سەگێک بمدۆزێتەوە، تۆ نەبێت؟
دەشێ، کتێب بێزم لێبکاتەوە
کتێبخانە دەرگەی خۆیم لێ دابخات



چاخانەیەک پیاڵەیەک لە مەرگم بۆ بێنێت!
پاکەتێک جگەرە هەڵبێت لەدەستم
کچێک بە بینینی رووخسارم بڕشێتەوە
کۆڵانێکی منداڵییم نەمناسێتەوە!
نامەیەکی سەردەمی عاشقبوونم سپی بچێتەوە
مەرگ بمکاتە بۆسەوە
ژیان بمکاتە رستەی کولانەیەکی سەگەوە
لە کتێبێکی ناتەواودا تۆ بمدۆزیتەوە ..
بەیانییەک، بۆنی تۆ دەکەم لەدوورڕا
چاوەڕێی بەخشینی نیگاکانتدەکەم
دەرم بێنی لە قوڵایی تەنیاییدا
بەیانییەک باران دەبارێت
دەلەرزم بەوێنەی ترس
شەقامەکان لە پیاسەدان
هەست بەونبوونی من دەکەن
پەنجەرەکان دەکرێنەوە
بە بێ رامان جێدەمێنن
دەستم نییە پێوەی بدات
کورسییە چۆڵەکەی باخچەکەمان
کەسی لەسەر دانانیشێت ..

پەرداخێک ئاو چاوەڕێمە
بمخواتەوە بە وێنەی خۆم
کولانەی سەگێک هەڵی گرتووم
پاراستوومی لە تەنیایی
بەرگێکی دیکەی لەبەرکردووم
جوانتر لە بەرگی ژیانم!
بەیانییەک، رەنگی نیشتمان سوور بووە
شەو بەو هەموو ئازارەوە وڕێنە دەکات
درەختێکی پیر بەدوای کەسێکدا دەگەڕێت
پەرداخێک مردن چاوەرێی لێوێک دەکات!
تۆ، هەمیشە بە شۆخییەوە دەمدۆزیتەوە
دۆزینەوەی من لە کولانەی سەکێگدا
ئەشێ، درەنگ بێت زۆر درەنگ
لە مرۆڤبوون کەوتبم
توانای پەیڤینم نەبێت جگە لە زمانی نیگاو حەپەحەپ
فڕینم یاد چووبێتەوەو لەسەر دەست برۆم
گوریسێکی چنراو بە رابوردوو بکەیتە ملم و رامکێشیت!
وەک راکێشانی غەمی ژیان بەکۆڵمەوە
دەشێ لە کولانەی سەگێکدا دەرمبێنی
وەک دەرکردنی شەممەیەکی گەمژە لە رۆژژمێری بەدبەختیی



وەک دەرکردنی جوانیی لە ئاوێنە!
دەشێ بمهێنیتەوە نێو پەژمووردەیی ژیان
ئاشتم بکەیتەوە لەتەک بۆنی شیعر
دیسانەوە فێری زمانی عەشقم بکەیت
زمانم بپەیڤێت بەوێنەی رەنگەکان
دەترسم، بمبەیت و ئاسوودەیم لەم کوڵانەدا جێ بمێنێت
سەگەکانی هاوڕێم نیگەران بن لە ونبوونم
پرسەی تەنیاییم بۆ دابنێن!
ئاوەزم لە کولانەی سەگێکدا خۆی بکوژێت
دەترسم بمدۆزیتەوەو نەمناسیت!
دەترسم بتدۆزمەوەو نەتناسم!

**ئۆکتۆبەری ٢٠٠٩**

# ژیانکردن، وەک تەنیایی!



لەقەرەباڵخیدا هەمیشە تەنیام،
لەتەنیاییدا هەمیشە قەرەباڵخم،
بەبرینێکی خوێناوییەوە هاتمە ژیان
تا هەنووکەش لەناوەوەمدا دەژی
ناوی خۆی ناوە تەنیایی!
حەز دەکەم لەکۆڕێکی شیعریمدا
بەتەنیا شیعر بخوێنمەوەو
لەپرسەی مردنیشمدا بەتەنیابم ،
تەنیایی، دێت بۆ چاخانەکان لەگەڵمدا
جگەرەم بۆ دادەگیرسێنێت
هانم دەدات بۆ نووسین
تەنیایی، وەک خواردنی رۆژانەم
بووەتە پێویستیی،
ماڵ،
گۆرانیی،
شیعر،
کەسێک بەلاستیکێکی عاشقانەوە
ویستی تەنیاییم بۆ ئەبەد بسڕیتەوە

تەنیاتری کردم!
کتێبێک، بەباوەشێک لاپەڕەی نەرم ونیانەوە
ویستی دەرم بێنێت لەتەنیایی و نەیتوانی
خراپتری کردم بەرەو تەنیایی،
ڕێگەیەک وەک ناکۆتا دوور
دەستی پێیەکانمی گرت و
بەرەو تەنیاییبوون بۆ ئەبەد بردمی!
جەستەم بەدیار تەنیاییەوە داڕزا،
پەنجەکانی دەستم هەڵوەرین
چاوەکانم رەنگی تەنیایی گرت و
هەموو شت بەتەنیایی دەبینم!
تەنیایی،لە ئازار دەچێت
نەدەبینرێت،
نەدەنووسرێت،
نەدەخوێندرێتەوە،
وەک خۆی!
تەنیایی، بەو هەموو دەرگا دۆزەخییەیەوە،
هەر کات لێی نزیک بووبێتمەوە
هەستمکردووە زۆر سەرمام دەبێت!
تەنیایی ،ئەوەی فێرکردم



کەئەوان جێیان هێشتم
ئیدی من تەنیا نیم بۆ هەمیشە!
تەنیایی، روناکیکردمەوە بەتەنیایی!
ئاوەدانی کردمەوە بەچۆڵەوانیی!
جوانی کردمەوە بەناشرینیی!
تەنیایی،وەک− با− باوەشی پێداکردم
بردمی بەرەو ناشوێن،
سوپاس بۆ تەنیایی
دەرگەکانی مردنی نیشاندام و
ئاوێنەکانی شکستی بۆ پاککردمەوە،
پیاوێک تەنیایی لەخۆی مارە دەکات
پیاوێک منداڵی دەبێت لەڕەگەزی بەدبەختیی،
شیعرێک بەزمانی خۆکوشتن دەنووسێت
کار دەکات بەپاداشتی شکستەکان
مۆنمێنتی ئازار لە فلتەری سیگار درووست دەکات
پیاوێک لەناوەوەمدا دەژیی،
بێ ئەوەی مافی پەنابەری وەرگرتبێت
لەشانشینی تەنیایی!!!
تەنیایی، جێگەم بۆ رادەخات
لەسەر زەویی تارمایی،

تەنیایی، دەمباتەوە گوندەکەی خۆمان
پاشماوەی ئەو گەمانەم بۆ دەدۆزێتەوە
کەبەمنداڵیی جێمهێشتبوون،
تەنیایی، فێری زمانی گوڵەکانم دەکات و
بە سەگێکی هارم دەناسێنێت،
وەک هاوڕێیەکی زۆر دوور باوەشم پێدا دەکات
تەنیایی،پێش هەستانم لەخەو دەموچاوم دەشوات
بەپەلە ئاوێنەکەم بۆ دێنێت و
قژم،بە خەڵوزی دۆزەخ بۆیە دەکات!
تەنیایی،پێم دەڵێت جوان بوەستە
وێنەیەکی تەڵخم دەگرێت و
دواتر نامداتەوە،دەڵێت خۆت ناناسیتەوە!
تەنیایی ،لەدرەنگی شەودا هەڵمدەسێنێت لەخەوو
پێمدەڵێت مەنوو بێ بیرکردنەوە لەکەسێک،
تەنیایی، دێتە نێو بۆشایی پیتەکانی ناوی منەوە
رۆژگارە کلۆرەکانم بە پەژموردەیی پڕ دەکاتەوە!
تەنیایی، پێش من دەست دەکات بەگیرفانە بەتاڵەکانمدا
پێش من قسە لەگەڵ جلەکانمدا دەکات
تەنیایی،پڕم دەکات لەبرین
برینی جودا جودا



لەشێوەی ئایندەم،
رابوردووم،
ئێستام،
ئای تەنیایی،
جگە لە تۆ کەس بەو شێوە جوانە تەنیای نەکردم
ئای تەنیایی ،
ژیانکردن لەگەڵ تۆدا
مانای ژیانی راستەقینەبوو بۆ من
ئیدی تۆ هەموو شتێکی بۆ من
هەموو شتێک ..

**مارسی ٢٠١١**

# ونبوونەکان



لە دۆزەخێکدا ونبوومە
ئیمان بەهەموو رەهەندەکانییەوە
ناتوانێت قوتارم بکات!
لە دڵی کچێکدا ونبوومە
هەرگیز ناتوانێت دەرم بێنێت،
مەگەر ببێتە سۆزانیی و لەشی بە کەسێک بفرۆشێ
وەک سەگێک چۆن بەدوای بۆندا مل دەنێت
وەک ئاوێکی سەرلێشێواو لە تاڤگەیەکەوە بەنەزانی خۆی بەرداتە
خوارەوە
وەک باڵندەیەکی نابینا دوور لە چێژی جوانیی ئاسمان
ئاوها ونبوومە و خۆم نادۆزمەوە!
ئەشێ لە نێو گەڵایەکدا نووستبم و
پاییز بە وەرینەکانییەوە ئابرووم بەرێت ،و
بۆ باخچەکان شرۆڤەم بکات
ئەترسم هەورێک لە تەک خەیاڵەکانم ونی کردبم
بارانێک بەشەرمەوە بۆنم بڵاوبکاتەوە
بە منداڵیی یادمە کتێبێکی رەنگاو رەنگ ونیکردم

کە گەورەبووم عەشق بەهەموو ئازارەکانییەوە نەیدامەوە بە دایکم
ونبوونی من جودا لە ونبوونی هەتاوە لە خاکدا
یەکەم ونبوونم تەماشاکردنی ئاوێنەیەک بوو ،
بۆ یەکەمین سات
بە سەرسامی خۆی ونی کردم!
ون دەبم و نازانم بۆ؟
ونبوونێک پڕ لە بۆنی سێبەر،
ونبوونێک خاڵیی لە مردن،
هێندە ونبوومە و مەستی گەڕاندومیەتیەوە بۆ ژیان
هەندێ سات خۆم ناناسمەوە!
بەدوای ڕێگەیەکی تاریکدا دەڕۆم و ون دەبم،
بەمەبەستی دۆزینەوەی دەرگەکانی تەنیایی
لە ژێر بەردێکی بێئومێددا مارێک دەمدۆزێتەوە
دەمداتە دەست مەرگی باوکم
بە دوای دوکەڵی جگەرەیەکدا دەڕۆم و ون دبم،
بۆ دۆزینەوەی نهێنیی فڕینەکان!
پارچەیەک لە ئەستێرەی شکاو دەمدۆزێتەوە و
دەمداتە دەست ڕەشبینیی،
من هەمیشە ون دەبم، ون
لەتەک نیشتماندا چەندین جار ونبووم



ئەنفال بردمی و نیگاکانی نەدامەوە دەستی خاک
شەڕی ناوخۆ لە شاخێکدا جێی هێشتم و خۆم خواردەوە
کۆچ بەتەنیا ڕۆیشتوو لە ڕێگە ونیکردم و جێی هێشتم
وندەبم و با دەمهێنێتە بوون!
لەڕەگەوە وەک درەختێک رووتم دەکاتەوە
باران لە ونبوونم بێدەنگ دەبێت
لە باخچەیەکدا بۆنی گیا ونم دەکات
بەدەستەکانی ژیانەوە وندەبم و
پێیەکانی مەرگیش نامدۆزێتەوە!
ونبوون،یانی دواکەوتن لە بینینی گەمەکانی —با— بەهەنار
ونبوون ،یانی پشتکردن لە داکەندنی بەرگی ناکۆتا
ونبوونی ریقنەی چۆلەکەیەک لەئاسمان کە دەکەوێتە سەر زەوی
ونبوونی پەشیمانییە لە ئێوارەیەکی بێهودەدا ،
ونبوونی من لە کتێبێکی کۆنی ڕژاو
ونبوونی پوچییە لە بیابانێکدا بەدوای ئاودا بگەڕێت
ونبوونی من لەبۆنی دەریا
ونبوونی سەرخۆشێکە مەست وەک ڕۆشتنی ئاو نابینا!
ونبوونەکان بۆکوێ دەمانبات؟
کوێ؟ دەستی هەیە لەونبوونمان
ونبوون بەدەم جگەرەکێشانەوە،

ونبوون له لێواری شیعرێکەوه،
ونبوون بە دوای بینینەوه،
بینینی ونبوون
ونمان دەکات ون!
زەنگێک خۆی دەشارێتەوه له ترسی ونبوون
دزێک بە دوای ونبووندا دەگەڕێت
کچێک له قەیرەیی خۆی ون دەکات
ئاوێنەیەک دەرگە بەدەرگە بەدوای ونبوون دەگەڕێت
چاوشارکێکە، تەواو دەبێت
ونبوون خۆی نادات بەدەستەوه
لەشوێنێکی دوور دوور –با– دەیبینێت
وندەبین و گەمەکانی منداڵیی جێماندەهێڵێت
وندەبین و نیشتمان نامانناسێتەوه،
کۆم دەبینەوه له ونبووندا
سەرما لەباوەشمان دەکات
ونبوونەکان دابەشمان دەکەن،
ونبوون له نێو ونبوون
چ ئازارێکی میهرەبانە!
ونبوون له نێو ونبوون
دۆزینەوەی خودە له بووندا،



نازانین چۆن وندەبین؟
هەندێ جار لەتەک عەشقێکدا دەڕۆین و ون دەبین
هەندێ جاریش بەدیار گوێگرتن له مۆزیکەوه وندەبین
هەندێ جار سێبەرەکانمان دەنێرین بۆ سەفەر و خۆمان وندەبین
هەندی جار جلوبەرگەکانمان دیار و خۆمان ون
هەندێ جار خەیاڵ ونمان دەکات
هەندێ جار ژیان ونمان دەکات و مەرگیش ناماندۆزێتەوه!
که ون دەبین کەس باسمان ناکات
که ون دەبین کەس هەواڵمان ناپرسێت
که دەماندۆزنەوه هەر کەس باسمان ناکات
کەس هەواڵمان ناپرسێت،
ونبوونەکان له ڕۆحماندایه و ونه
وندەبین و چاکە سارد دەبێتەوەو ئەو دەمانخواتەوه
وندەبین و ئێمە بارانەکە تەڕ دەکەین بە جوانیی
وندەبین و ئێمە هاوار له دەنگ دەکەین
وندەبین و سەرما ڕەق دەکەینەوه
بەونبوونەکانمانەوه دەچین بۆ سەفەر
پەرش و بڵاوی خۆمان پینە دەکەین بە گۆرانیی

**یەنایەری٢٠١٠**

# مردنەکان



شەوێک دەمرم

دایکم بۆ نوێژی بەیانی خەبەرم دەکاتەوە

پڕم لە خەونی کوژراو و دەنگی سەرسامیی ئێوارە،

بەدەم گوتنەوەی گۆرانییەکی تەڕی بارانەوە دەمرم

بە رامان لە کتێبێکی کۆنی ئەفسوناوییەوە

بە کرانەوەی دەرگەیەک لە فەرامۆشیی

دەمرم و کەس نایەت بۆ پرسەکەم خۆم نەبێ!

بەدیار ژماردنی دەنک دەنک تەسبیحەکەمەوە

بە دیار ژماردنی دەنک دەنک ئەو جگەرانەی کەدەمکێشێت

بەدیار خۆمەوە دەمرم،

وەک کیسەڵێک چۆن لەترسی ژیان رادەکات

کڕنووش بۆ هەزار پێیەک ببات،

وەک خەیاڵێک چۆن ناگاتە کۆتا

خۆی دەکوژێت

وەک شیعرێک چۆن نانووسرێت

بە ئیفلیجیی دێتە ژیانەوە،

وەک سەفەرێک بەرەو ناشوێن
دەمرم و مردنەکان دەمنووسنەوە!
رۆژێک منداڵ دەبمەوە و دەمرم،
رۆژێک لە قوتابخانە لە ترسی مامۆستا دەمرم
رۆژێک رێگەی ماڵ نادۆزمەوەو دەمرم
رۆژێک چاوەڕوانیی شەوێک دەمکوژێت
رۆژێک دەمرم و خۆم هەواڵ دەبەم بۆ دایکم
رۆژێک پێڵاوێک لەپێم دەکات و دەمرم
ژیان بەبەرم ناکات و دەمرم
کتێبێک دەمشارێتەوە دەمرم
قاوەیەک دەمخواتەوە دەمرم
رۆژێک ،ئەشێ رۆژێک
مردن بمبات بۆ ماڵی سەراب و نەیەمەوە
مردن بە ژانتایەک یادەوەرییەوە بێت و بمبات
لە پشت سێبەری یارەوە بێت و نەیناسمەوە،
رەنگە مردن بێت و من مارەی بکەم لە خۆم
کتێبێک و پاکەتێک جگەرە مارەیی بێت،
رەنگە مردن پێش ئەوەی خۆم بکوژم بێت
رەنگە مردن بێئاگابێت و من بمرم
لەساتی بیرکردنەوە لە ئاو بمرم



لە ساتی ژماردنی ئەستێرەکان بمرم
لە ساتی ناسینەوەی کوفرەکان بمرم
لەساتی نووسینی وشەیەک لە شیعر بمرم
ئەشێ، بەدیار چاوەڕوانیی مردنەوە بمرم!

**ئەپریلی٢٠١٠**

# ئەم وشانە،زۆر بێزارن!



بەنیازم ئیدی لەبارەی خۆشبەختییەوە بنووسم؛
ئاە کەناخۆشە،
چەند ئازاراوییە،
کەهیچ نازانم لەو شێوازە .

چەند ئاسوودەم کەباوەشت پێدادەکەم و
ماچت دەکەم؛
تەنیاییم



غەمگینیی بە شێوەیەک داگیری کردووم،
خۆشبەختییەکانی منداڵیشی بیر بردوومەتەوە

ئای کوڕەکەم، کە نیمە
دەمەوێت شتێکی گرینگت بۆ بنووسم
-هیچ شتێک لە دونیادا گرینگ نییە-



بەوەدا دەیزانم دونیا زۆر ساردی کردووە،
دیسانەوە تۆ بیرم ناکەیت!

زۆر ماندووم، زۆر
نامەوێت لەهیچ کوێ پشوو بدەم
بەدوای رێگەیەکی دیکەدا دەڕۆم،
ماندووترم بکات لە ئێستا !



رۆژێک پێتدەڵێم خۆشمدەوێی
بە نووسین،
نا، بەهاوڕێیەکم دەڵێم پێتبڵێ
نا، لەبری تۆ بەخۆم دەڵێم!

که لەتەنیایی بەردەبمەوە،
یەکسەر دەشکێم و دەبم بەهەزاران پارچەوە
کەدەشکێم ، پارچەکانم تەنیاتر دەبن
هەر تەنیاییش کۆمدەکاتەوە!



دڵنیام هەموو شتەکان باش دەبن
شێتە جوانەکانی شاریش،
بەتەنیا من نەبێت!

رۆژانێکە بەئەندازەیەک بێزارم
بەکەڵکی هیچ نایەم،
تەنانەت بەکەڵکی لەپێکردنیش!



تۆ بنوو،ئازیز تۆ بنوو
من ئەمشەو نانووم،
نەوەک خەونی ناخۆشت پێوە ببینم!

هیچ ساتێکی غەمگینیی
پرۆژەی خۆکوشتنم نەبووە،
تەنیا ئەو ساتانە نەبێت
کە شتێک هەبووە و ئاسوودەم دەکات، ئاسوودە!



غەمگینییەکی سەیر داگیریکردووم
دەڵێی دوا دێڕمە دەینووسم،
دەڵێی دوا هەناسەمە دەیدەم،
دەڵێی دوا سڵاومە لێت دەکەم،
دەڵێی دواین خاڵە لەپاش خۆم دایدەنێم.

لەئێستادا بیری کەسێک دەکەم و

نازانم کێیە؟

لەئێستادا کەسێک بیرم ناکات و

دەزانم کێیە؟



جیاوازی من و تۆ لەوەدایە،

من بیر لەرووخانی ماڵەکەم دەکەمەوە

تۆ بیر لەدرووستکردنی ماڵێک دەکەیتەوە!

ئێجگار سەیرە،

زۆر زۆرم خۆشدەوێیت و

تا هەنووکە نەمبینیویت

لە ئێستادا زۆر دڵنیام کەهەڵە نیم

لەم دێڕەی خوارەوە نووسیوومە:

خۆشەویستیی،تەنانەت بە بینینیش کاڵدەبێتەوە!



نەمزانی وا بەسانایی ون دەبیت

ئەگینا خۆم سەرقاڵ نەدەکرد بەکتێبە کۆنەکانەوە،

گوێم لەهاژەی ئاو نەدەگرت و هێندە خۆم شپرزە نەدەکرد

نەمزانی،ئەگینا هەر لەتەنیشتت دادەنیشتم و تەماشام دەکردی

وەک تەماشاکردنی خۆت لەئاوێنەکەتدا.

من چاوەڕوانی کەسێک دەکەم
کە نایەت،
کەسێک چاوەڕوانی من ناکات
کەدێم!



لەو ڕۆژەوە،
دەستی راستم لەدەست داوە
کەتەوقەم کرد لەگەڵ تۆدا !
ئەویش دیارییەکی چکۆلانەی منبوو
پیرۆزت بێت ئازیزەکەم

چ ناخۆشە، بەختەوەربم!

تەنیا،ئومێدم ئەوەیە بێئومێدبم



بیرت نەچێت،

هەتا دوور بیت لەمن نزیکتر دەبیتەوە!

هەتا نزیکتریش بیت،

دوورتر دەبیتەوە لە من!

زۆر بەپەلەم، هەمیشە پەلە دەکەم

بۆ گەیشتن بە لەسەرخۆیی!



ئەمرۆ بەتەنیا،

بیرم لەوە دەکردەوە

چۆن بتوانم ئیدی بیرت لێنەکەمەوە؟

هێندەی نەمابوو بکەوم و
بشکێم،
خەیاڵی کەسێک گرتمییەوە،
کەسێک کەهەرگیز بوونی نییە!



بۆ لێرەوە تێناپەڕێت،
دڵی منیش بدەیتەوە
خۆت نا، سێبەرەکەت!

منداڵانە تۆم ناسی،

منداڵانە خۆشمویستی،

منداڵانە جێمهێشتی،

منداڵانە ئەمەم نووسی

منداڵانە خۆم کوشت!



رووناکی چییە؟

ئەگەر تەنیا

تارماییەکانیشت هەبن!

نیگایەکت بەسە،
بۆ ئەوەی هەموو دەرگەکان بکرێنەوە.



ئای دایە گیان،
هەرچەند دەکەم ناتوانم بێمە ژوورەوە
پێڵاوەکانم لەپێیەکانم دەرناچێت،
چاوەکانم دەرچوو بەرێگاوە
کەچی کەسێک لەخەیاڵم دەرناچێت!

بانگی تۆ دەکەم،
قاوەکەم بەتەنیا ساردەوە بوو
جگەرەکەی دەستم با کێشای
ئێوارە بەوەڕسییەوە سەری خۆی هەڵگرت،
شەویش چووە جێگاکەیەوەو زوو نووست!
بەیانیش خەبەری نەبووەو دەمووچاوی نەشووشت !



فەرامۆشیت تەواو، بۆ هەمیشە فەرامۆشیت
ئەو رستەیەی سەرەوە ناتەواوە و
هەرگیز لە وتەی تۆ ناچیت!
دڵی خۆم بەو رستەیەی دووەم دەدەمەوە
ئاه،لە دڵی من
دوێنێ لای پینە دۆزێک هێنامەوە!
ئیدی بەرگەی شکان ناگرێ
وا باشترە،بیدەمە دەست
پشیلەیەک،سەگێک،بۆقێک
بۆخۆی بیخوات!

بومەلەرزەیەکی تر بەڕێوەیە!

بەرێختەری تەنیایی

بەرێختەری ماڵئاوایی

بەرێختەری.............بۆشایی



هەمیشە ئەو مرۆڤانەم خۆشویستووە،

کە لەڕێگەی ئازارەوە ناسیومن،

کە لەڕێگەی ئازارەوە دەمناسن،

جگە لەکەسێک!

رۆژانێکە بیر لەو ساتانەت دەکەمەوە،

کە تۆ بیرم ناکەی!



لەیەکی نیسانی ئەمساڵدا،

کەسێک بەچەکێکی لاستیکی منداڵانە کوشتمی و

تەنیا رێگەی بەم نووسینەدا بینووسم!

گرینگ ئەوە نییە تۆ دووریت،
گرینگ ئەوەیە تۆ هەیت!
گرینگ ئەوە نییە زەوی و مرۆڤ وا تەواو دەبن،
گرینگ ئەوەیە تۆ هەمیشەییت!



ئەگەر بزانم،
تەنیاییم لە تەنیایی هەر کەس دەچێت،
ئیدی ناهێڵم هەرگیز تەنیابم.

مرۆڤ بۆ هەمیشە یەک جار دەتوانێت بەجوانیی:

بفڕێت،

عاشق بێت،

خۆی بکوژێت،

تەنیا، ئەو کاتەی کە بەتەنیایە!



ئەمڕۆش ژیام،

بەشی ئەمشەویش فرمێسکم پێماوە!

دەمەوێت دەرچم لەم چاڵە تاریک و قوڵەی ناوی زەوییە،
وەک دەرچوونی من لەیادەوەریی تۆ!



چاوەڕوانییەکانی تۆ نەبایە،
چێژم لەکردنەوەی پەنجەرەکان نەدەبینیی!

دیسەمبەری ٢٠١١

چەندین جار،
داوای بەخشینم لەپێڵاوەکانم کردووە
کەبەرێگە دووبارەکاندا دەیبەمەوە!
چەندین جار،
داوای بەخشینم لەدەستەکانم کردووە
کە بۆ تۆ درێژم کردو تارمایی بووی!



## چاوەڕوانییەکان

بێزاریی من لەژیان،

وەک بێزاربوونمە لەدەرگەکان

لەکردنەوەیان!

لەداخستنیان!

لەشکاندنیان!



بڕوام نەدەکرد بەو ئەندازە سادە بم

لەدووری دوورەوە

بە بۆنت بتناسمەوە،

بڕوام نەدەکرد،هێند شپرزەبم

بە نیگایەکت خۆم ونبکەم !

لێرە زۆر باشم !
هەموو شت باش دەڕوات،
تەنیا خۆم نەبێت
بەدارشەق دەڕۆم
تاسە دەکەم،
لەسەر دەست دەڕۆم،
هەندێ جاریش
بە پشتا دەڕۆم.



من، هەر چاوەڕێت دەکەم
ئەگەر بە سڵاوێکی بێ دەست بێت
یان بەنیگایەکی بێ چاوەوە،
یان بەبێ دڵ بگەڕێیتەوە
تەنانەت بەتارماییەکانیشت!
دەمگەڕێنیتەوە نێو ژیان

خۆشم دەوێی!

لەسەرەوە وام بۆ نووسیویت،

خۆشم دەوێی!

لەخوارەوەش هەروا،

لەهەموو لایەکەوە گەمارۆم داویت بەخۆشەویستیی،

چ دیکتاتۆرێکی عاشقم!

هەموو دەروازەی دەرچوونم لێگرتوویت.

**فێبرایەری ٢٠١١**

# گەمەکان



با گەمە بە درەخت دەکات
درەخت بە گەڵا
گەڵا بە زەوی
زەوی بە رۆحی من
رۆحی من بە ژیان

ئاسمان گەمە بە ئەستێرە دەکات
ئەستێرە بەچاوی تۆ
چاوی تۆ بە من
من بە مەرگ
مەرگ بە جوانیی



باران گەمە بە پرچت دەکات
پرچت بە دەستی من
دەستی من بە جگەرە
جگەرە بە هەناسەم
هەناسەم بە ونبوون

سەفەر گەمە بە نیشتمان دەکات

نیشتمان بە وێرانبوون

وێرانبوون بە عەشق

عەشق بە فڕین

فڕین بە ناکۆتا



رابوردوو گەمە بە رانەبوردوو دەکات

رانەبوردوو بە ئاینده

ئاینده بە ئاسودەیی

ئاسودەیی بە چارەنووسی من

چارەنووسی من بەتەنیایی

ئاوێنە گەمە بە رووخسارم دەکات

رووخسارم بە تەمەنم

تەمەنم بە بێهودەیی

بێهودەیی بە شیعر

شیعر بە ئاوەزم ..



ئاو گەمە بە ئاگر دەکات

ئاگر بە شاعیر

شاعیر بە وشە

وشە بە خوێن

خوێن بە خۆکوشتن ..

ژووان گەمە بە شوێن دەکات

شوێن بە نامۆیی

نامۆیی بە مەستیی

مەستیی بە چاوەڕوانیی

چاوەروانیی بە من

**فێبرایەری ٢٠١٠**

## کۆتاییەکان



دڵم بەو شەوانە خۆشە،
کەهەمیشە لەرۆژ دەچن
دڵم بەو رۆژانە خۆشە
کەهەمیشە لەشەو دەچن
شەوو رۆژە ئاساییەکان ئی من نین!

دەمەوێت،
هەروا بە نهێنیی خۆشمبوێی،
کەس نەزانێت
تەنانەت :
تۆ و خۆشم!



ئای هەورەکان،
بە ئەندازەی غەمگینیی دڵم پێتان خۆشە

ئەمشەو،
هەردووکمان بەیەکەوە دەنووین
من و ئەمشەو!
بەیانی،
هەردووکمان بەیەکەوە دەمرین
من و بەیانیی!



من لەهەموو کات و شوێنەکاندا
لە خۆم دەچم
وەلێ، نازانم بۆ؟
کەتەماشای ئاوێنەکان دەکەم
لەبری خۆم، تۆ دەبینم!

ئەو کاتژمێرانەی چاوەڕوانت بووم،

زۆرتربوون، زۆر

لەو کاتژمێرانەی ژیاوم و دەژیم!



ئای تەنیایی،

نە رێگەم دەدەیت بێمەوە نێو ژیان!

نە رێگەم دەدەیت لەژیان دەرچم!

له وشەکانی ئەو رستانەدا رادەمێنم،
کە پیتەکانی ناوی تۆ درووست دەکەن!
بەتایبەت ،ئەم دوو دێڕەی سەرەوە !!



دەمنووسی، بۆ ئەوەی تەنیا نەبم
وەلێ،نووسین تەنیاتری کردم!

ئاپریلی ٢٠١١

## لەساڵی نوێدا، تۆ لەکوێی ؟



کەی دەستەکانت دەهێنیت؟
من هەموو شتێکم لەدەستدا
تەنیا دەستەکانم ماوە!

دەستت بگرە بەدەستمەوە،

بومەلەرزەیەک بەڕێوەیە

بەرێختەری لەناوچوون.



لەگۆرەوییە دڕاوەکەمدا،

بیر لەکەلەسەری خۆم دەکەمەوە

لەگۆڕەکەشمدا هەر بیر لەتۆ دەکەمەوە

کەسی تر نا، هەر تۆ

چۆن دەگەڕایت منت دەدۆزییەوە
لەهەموو شوێنێک من هەبووم،
لەنێو کتێب ،لەرۆژنامە، لە دۆزەخ ،لەکولانەی سەگ، لەنازانم کوێ!
چۆن دەگەڕام تۆم نەدۆزییەوە
دەترسم لەمندا ونبووبێتی و نەزانم،
دەترسم کاتێک بتدۆزمەوە
چاوشارکێی ژیان تەواو بووبێت
دۆزینەوە تەواو بووبێت
وشە تەواو بووبێت
من تەواو بووبێتم.



کە تۆ دێیت
وشەکان دەکەونە سەما،
رستەکان گۆرانی دەڵێن
مردن بەخۆی و دەنگە ناخۆشەکەیەوە هەڵدێت
کە تۆ دێیت
پڕ دەبم لەژیان ،
پڕ دەبم لەوردە ئەستێرە ،
ئاسمان دێتە ژوورەکەم و مانگیش میوانی هەمیشەم،
کەتۆ دێیت ،ئەستێرە یەکە یەکە دەخۆمەوە، باران دەست لەملم دەکات،
هەور دەبێتە باڵێک و دەفرم بەرەو ناشوێن
کە تۆ نایەیت
دۆزەخ بە ئاوێنە شکاوەکانییەوە دێت،
ئازار بەخۆی و دارشەقە کۆنەکەیەوە دێت،
کەتۆ نایەیت تەنیا مردنم لێوە دیارە و تەنیا غەمگینی باوەشم بۆ دەکاتەوە
کە تۆ نایەیت کەس نایە کەس،
تۆ نایەیت تۆ

ئە و ساتانەی کەبیرت لێناکەمەوە
هەر بیرت لێدەکەمەوە،
تەنانەت ئەگەر هەردووکمان بین
هەر بیرت لێدەکەمەوە!



زۆر لەمێژە
ئاگایی خۆم لەدەست داوە
ئیدی ئاگام لەتۆ دەبێت، هەر تۆ.

ئەگەر منت خۆشدەوێت!
وەک دوژمن تەماشام بکە،
وەک دوژمن بمکوژە،
وەک دوژمن خۆشت بوێم،
ئەگەر منت خۆشدەوێت
تکایە خۆشت نەوێم.



چ تەمێکە،
هیچ نابینم
جگە لەتۆ.

باران دەبارێت، من هەر تەنیام

نەبارێت، من هەر تەنیام

مرۆڤ دەبارێت، من هەر تەنیام

دۆزەخیش ببارێت ،تازە من هەر تەنیام



من لەئێستادا

پێویستم بەبەرگی کیسەڵە

بۆ هیچ نا

بۆ پاراستنم ،لە عەشق

بۆ پاسەوانیم ، لەداخی مرۆڤ

ئاساییە با لەسەر خۆمبم

خۆ من تازە درەنگ دەگەم

تازە من ناتوانم سەربکەوم

تەنانەت بەنووسینیش!

دەزانم کەی دەمرم

بەڵام هەرگیز نازانم

کەی دەتوانم،وەک مرۆڤ بژیم!



ئەم ئێوارەیە داوەتی ئاهەنگێک بووم،

ویستم جلە تازەکەم لەبەر بکەم

هەر چەندم کرد و نەمتوانی

دیسانەوە، بەناچاریی ئەم کورتە شیعرەم لەبەر کرد.

من، لەکۆتایی نووسینمدا
ئەوەی بۆ من گرینگە تۆم خۆشبوێت
ئاساییە ئەگەر تۆ هەر خۆشت نەوێم
هەر وەک چۆن ئیماندارێک لە خوداوەند
نزا دەکات و دڵنیایە کە نزاکانیشی هەر ناگات



هەرگیز-تۆ- تۆ نیت
ئەگەر-تۆ-تۆ بایتایە
من- دەبوویت نەک هەر خۆت

ئەوانی دی روو لەژیان دەکەن و پێ دەکەنن
منیش رووم لەماڵی ئێوەیە و سیگار دەکێشم
تۆش بەبێ دەنگی دەڵێیت؛
چاکەت ساردەوە بوو ،وەک هەستی من!



ئەم جارەش دەڕۆمەوە
بێزاربووم لەمرۆڤ،
گالیسکەکەم رادەکێشم،خۆم دەزانم بۆکوێ دەچم
بێزارم ،وەک بێزاربوون لەبۆنی دەمی بەیانیانی مرۆڤ

بەئەندازەیەک ماندووم
سەرم،هەر دەڵێی تەرازووەو
هەموو کیلۆ ئاسنەکانی دونیای کێشاوە
سنگم،هەر دەلێی مانگەو
دووکەڵی هەموو سیگارەکانی زەوی هەڵمژیوە
چاوم، هەر دەڵێی دەریایەو
کەچی هەر دەرناچێت لە ژیان،دەرناچێت لەوێنە سادەکانی تۆ



ماڵئاوایی، وەک دواین دێڕی من
ئیدی من لێرە نیم
لەوێش نیم
تەنانەت لەنێوانی وشەی ئێرە و ئەوێش نیم!

لەوەتەی یادم دێت هەر دەشکێم،ڕۆژێک بەدەست خۆمەوە،

ڕۆژێک بەدەست ژیانەوە،ڕۆژێک بەدەست ئەوەوە،

ڕۆژێک بەدەست نازانم چییەوە!



تۆ و خودا لەیەک شتدا لەیەک دەچن

هەردووکتان بۆ ئەبەد، منتان داگیرکرد

ببورە، ئەگەر ئیدی تەماشات نەکەم
کەی من دەتوانم بەرگەی رۆحی تۆ بگرم
تەواو ئیدی، من لێرەدا رادەوەستم ..



تکایە مەمکەرەوە؛ ئەگینا هاوار دەکەم خۆشمدەوێیت
هێندەی ژمارەی هەموو سیگارە کێشراوەکانی دونیا بیرت دەکەم ..

لەپاش تۆ

پڕ پڕم لەبۆشایی

بۆشایی گەورە گەورە

بەئەندازەی نێوان زەوی و ئاسمان

ئیدی کۆنابمەوە ، نا



دەرگەکان ناکرێنەوە، تەنانەت بەنووسینیش

بژی روخان

بروخێ ژیان ..

ئەمشەو دڵم شکا،
وەک پیاڵەکەی دەستی دایکم
وەک ئاوێنەی دەستی خوشکەکەم
وەک بەربوونەوەی زەوی لەدەستی خودا
ئاوها، دڵم شکا ..



هێند لە چاوەڕاونییدا ژیام
کاتژمێرەکەم خۆی لوول کرد و
گوتی پێویستت پێم نییە
ئیدی خۆت ئەندازیاری
چرکە و ترپەوخولەک ژمێریت!

لەپەنچەرەکەوە،
من تەماشای تۆ ناکەم
تەماشای رووخانی ئەو دیوارە دەکەم،
تۆش تەماشای رووخانی من دەکەی!



خۆشم نازانم بۆ؟
ئەوەی خۆشیبوێم، خۆشمناوێت
ئەوەی خۆشینەوێم،خۆشمدەوێت!

تۆ لە کوێی؟
من وا تەواو دەبم،
وەک تەواوبوونی رستەیەکی ئیفلیج
خاڵێک لەکۆتاییمدا دادەنێم.
وەک کۆتایی دواین دڵۆپی تینوێتیی
وەک دواین فۆتۆی رەش و سپی نێو کامێرایەکی ئێجگار کۆن
تەواو،من تەواو دەبم
وەک وشەی- تەواو-بوون.
لەکوێی کە تەواو بوونیشم نابینیت
تەواو.
تەوا .
تەو .
تە .
ت.
.

دیسەمبەری ٢٠١٠

سفر............



ژمارەی نامەکانت سفر و
منیش ئایندەم لەسفر دەچێت
ماتماتیکیش بێئاگایەو
لەخۆوە دەڵێت بەهەردووکتان ١٣؛

١

دەمەوێت گەورەترین چاویلکە بەکار بێنم،
تا دڵنیابم لەوەی ئایا مرۆڤ ماوە لەسەر زەویی؟

٢

ئەم رستەیە وەک من تەواو نییە ..



٣

خۆزگە ئەوەندە منداڵ نەدەبووم،
ئەوەندە منداڵانە نەدەژیام
خۆزگە،رۆژێک دەمبینی گەورەبوومە!

٤

تۆ دانیشە، لەناو ئەم رستەیەدا
من بەڕێوەم!

٥

بۆ ئەوە خۆشم نەویستیی
بڵێیت؛
سپاس ..

٦

لەم شەوانەدا خەوێکی سەیر ونامۆم بینی،
لەخەونمدا؛
وەک مرۆڤ دەژیام!



٧

ئەوان ناهێڵن،
ئەگینا حەزدەکەم بەتەنیا خۆم بم
بەڵام لە ناوەوەی تۆدا !

٨

لەسەرخۆبە ئازیز، لەسەرخۆ
بەزەییت بە جوانییدا بێتەوە،
سیگار دەکێشێت لە دۆزەخ!

٩

تەنیایی؛وەک ئاوی بۆڕییەکەی ئێوە بەستوومی!

١٠

من تەنیا گەشبینم،بە ڕەشبینیی!

نزیکترین کەس لە منەوە ،دوورترینە!



١١

من؛وەک ئۆپۆزسیۆنێکی فاشیل!

ئەگەر بڕیاربوو ،

ڕۆژێک ببم بە ئۆپۆزسیۆن

لەم دەستەڵاتی گەردوونەدا

هەرگیز ڕەخنە لەتۆ ناگرم!

بە تۆ نالێم؛

ئەم جوانییەت لەکوێوە هێناوە؟

# وێنەکان



دڵم خۆشە لەژوورەکەی منیت
خۆت نا،
وێنەکانت!

لەهەموو تەماشاکردنی وێنەکانت

پاش چەند رۆژێک،

چاوەکانم شوێنی خۆیان دەدۆزنەوە!



وێنەیەکم بگرە، ئازیز

خۆتت بیر نەچێت با دەرچیت

وێنەیەکم بگرە،

با ئازارەکانم دەربچێت

نەوەک خۆم نەناسمەوە و

وێنەیەکی بێ مانا بێت!

کەسێک بەدوای خۆشبەختییدا
بەسەر شکست و تەرمی مندا تێپەڕ دەبێت
دەیدۆزێتەوە،
من بەسەر ئاوەدانیی کەسێکدا دەڕۆم
کۆڵان و پەنچەرەکان، شەقامە رەنگاورەنگەکانی دەبینم
کەچی لەتەنیایی و بێئومێدییدا ون دەبم.



شوێنێک نییە بۆ خۆحەشاردان لەژیان
شوێنێک نییە مرۆڤی تێدا ببینیت،
شوێنێک نییە شوێنی راستەقینە بێت
کاتێک نییە کاتی راستەقینە بێت

ئیشێکی تازەم دۆزیوەتەوە
تەنیایی!
سەرقاڵی خوێندنەوەی کتێبێکی نوێم
تەنیایی!
ڕۆژێکی نوێم دۆزیوەتە لەهەفتەدا
کاتژمێرەکانی لەکاتژمێری ئێستا ناچێت
تەنیایی!
کەسێک لێرەوە تێپەڕی من نەمبینیی!
کەسێک لێرەوە تێنەپەڕی من بینیتم ..



من لەهەموو سەرکەوتنێکمدا
بە شکستەوە گەڕاومەتەوە،
لەهەموو هەستانەوەیەکمدا
خاپوور و پارچە بووم،
لەفڕینیشدا هەمیشە وەک خشۆکەکان
بەسەر زەویدا ڕۆیشتووم ..

هێندە درز لەجەستەمدا درووستبووە،

هەر کەس دەستی بەر من کەوێت

بەسانایی دەتوانێت

دڵم بهێنێتە دەرێ

هەر وەک چاوم!



چ رۆژانێکی تاریکە

قاوەی تاڵ دەکێشم،

سیگاری رەش هەڵدەقورپێنم،

تێزاب دەنۆشم،

با دونیا ژێرەو ژور بێت

وادەم تۆ هەیت▪

**مایۆی٢٠١١**

بەئەندازەی یەکەمین پێڵاوەکانی منداڵییم،
خۆشم دەوێی!



بەسادەیی..........

لەباخەکاندا،

بەدوای ئەو درەختانەدا دەگەڕێم،

کە لەشێوەی یەکەم پیتی ناوی تۆیە،

باوەشیان پێدا دەکەم و وێنەیان لەگەڵ دەگرم!



لەشەو و رۆژێکدا،

٢٥ کاتژمێر بیرت لێدەکەمەوە

ئاه، کەبیریشت لێدەکەمەوە دەگریم!

بەوەدا دەزانم منت زۆر خۆشدەوێت،
ئارەزوو دەکەی تا هەتایە
من نەبینیتەوە!



غەمگینییەکانت و
توڕەبوونەکانت و
پێڵاوەکانت و
شتە خراپەکانیشتم
خۆشدەوێت!

چاوەکانت، بەئەندازەیەک گەورەن

هەموو شتێک دەبینن، هەموو شتێک

بەتەنیا من نەبێت!



ئەگەر تۆ نەبایتایە،

تەنیاییم،تەنیاییەکی رەها دەبوو

خوداش ئەمەی پەسەند نەدەکرد

ئەشێ هۆی ئەوە بێت،تۆی درووستکرد!

بیرکردنەوە لە تۆ،

تک، تک، تک

فرمێسک لەچاوانم دەڕێژێت بەرەو ئاسمان

نەوەک زەویی!



حەز دەکەم بەیانییەک خەبەرم بێتەوە،

ببینم خەبەرم نەبووەتەوە!

لەوەتەی یادم بێت،
هەر چی شتێکم نووسیبێت
لەدوایدا هەر لێی پەشیمانبووم
بەتەنیا ،لەم نووسینە نەبێت!



تەرمێک لەناوەوەمدا کەوتووە،
ناهێڵێت بۆ هیچ کوێ بڕۆم
لەهیچ شوێنێکیش جێگیرم ناکات،
ئەشێ ئەو تەرمە خۆم بم!

ئێستا زانیم،
لەناوەوە زۆر قوڵم
رۆژانێکە کەسێک کەوتووەتە ناوەوەم
تا ئێستاش بەئاسمانمەوەیە،
نەکەوتووەتە سەر زەویم!

ئۆکتۆبەری ٢٠١١

کتێبی سفر



**ئەم کورتە شیعرەش،**
**پێشکەش بە تۆ !**

-بەپەلە-

ئێستا تێگەیشتم بۆ-لەسەرخۆ- دەمکوژیت!



یوسف کەوتە بیرەوە جوانتربوو،
من بێ ئەوەی بزانم چیم لێ دێ
بیر لە تۆ دەکەمەوە!

له ئێستاوه له دژی من
خۆیان ئامادەکردووه بۆ راپەڕین،
خەونەکانی ناوەوەم!



یەکەم جار کەدەریام بینیی،
ئیرەییم بەجوانیی تۆ برد!

ئای باوکە، منی یوسف خەونم بەهیچ ئەستێرەیەکەوە نەدی
تەنانەت مانگ و خۆریش!
کەس رقی لێ نەبووم وکەس نەیکردمە نێو بیرەوە
هەروەک چۆن کەس خۆشینەویستم!
ئای باوکە،یوسفەکەی تۆ لەخەونی نەزانی
تەنیا خۆی مژوڵکرد بە تەنیاییەوە!



سەرما گەیشتە دڵم،
من بە پیتەکانی ناوی تۆ خۆم گەرمدەکەمەوە!

ئەم زۆر سادەییەت، من دەكوژێت

ئەم كوشتنەت، ناوەوەی خۆمم نیشان دەدات

كە تۆم بینی،

ئیدی زانیم چەندە تەنیام!



جیاوازی تۆ و بەفر ئەوەیە؛

بەفر ئەگەری  هەیە ساڵێتریش بگەڕێتەوە

بەڵام تۆ هەرگیز!

غەمگینیم خۆشدەوێت،
هەمیشە وەک خەیاڵی تۆ ئامادەیە!



تۆ،
بەر لەوەی بێیت بۆ لای من
رۆیشتیی!

تۆ ناهێڵیت بۆت بنووسم،
تۆ ناهێڵیت وێنەت بکەم،
تۆ ناهێڵیت من لێرەبم!
تۆ ناهێڵیت لێرە بڕۆم!



تاقەتی هیچ شتێکم نەماوە،
جگە لەبیرکردنەوە لەتۆ و
نووسینی ئەم شیعرە درێژە بۆ تۆ

**ئۆگۆستی ٢٠١١**

# دۆزینەوەکان



باشت کرد منت دۆزییەوە،
ئەگینا سەگەکان دەیانخواردم،
پشیلەکان شەڕیان دەکرد لەسەر پەنجەکانم،
خۆکوشتن،چەندین جار هاتە ماڵم و خۆم نەدا بەدەستەوە
نیشتمان ،هەمیشە بەنەفرەتی دەکردم
ڕێگەکانیش وەڕس بوون لەپێیەکانم
باشت کرد منت دۆزییەوە
رزگارت کردم لەونبوون،لەمردن
پێستم بۆنی مەرگی گرتبوو،
هەناسەم بۆنی دۆزەخ
چاوم تەنیا گۆڕستانی دەبینی
باشت کرد ،ئەزیزم زۆر باش

ئەگەر کەسێک ،
دڵی خۆیت پێببەخشێ
چی لێ دەکەی؟
هەڵیدەگریتەوە،یان فڕێی دەدەیت؟
هەرگیز،ئەمەت لەخۆت نەپرسیوە



ئەفسوونی  من و تۆ، لەوەدا بوو
کەخۆشمان بڕوامان نەدەکرد
یەکتریمان دۆزیوەتەوە

کە من لێرەم، مانای ئەوە نییە لەوێ نەبم

کە من لەوێم،مانای ئەوە نییە لێرە نەبم



گەر ئەمجارە هاتیتەوە،

پێڵاوەکانت بەرەوە

ئەو ڕۆژە لەیادت چوو بوو!

کە لەسەر سەری من داتنابوو.

چۆن پەتێک دەکەیتە ملی سەگەکەت
بەدوای خۆتدا رایدەکێشیت،
منیش ئاوها
پەتێک لەدەستم بکە !
تەنیا بۆ شوێنە تاریکەکان، لەگەڵ خۆت بمبە
بەرەو ناشوێن، بەرەو ماڵی غەمگینی خۆت بمبە!



پێش ناسینی تۆ
لەباران، هەڵدەهاتم
لەژیان، هەڵدەهاتم
هەنووکە خوازیارم
هەرچی دڵۆپە بارانی ئاسمان هەیە
بەر لەوەی بکەوێتە سەر زەوی
بەر جەستەو رۆحی من بکەوێت!

دڵم نەهات لەوە زیاتر ئازارتبەم

ئەگینا تا ئێستاش خۆشمدەویستیی!

نۆڤەمبەری ٢٠١٠